رۆژی غەزای خەیبەرا بیست پیاو دەکوژێ، وە تفاقو کەلوپەلی هەر بیستیان دەبا بۆ خۆی. ئیتر خواە لە شەڕە مەیداندا بیکوژێ، یا لەناو ریزی شەڕدا بیکوژێ، یا لە پشتیەوە بۆی بچێو بیکوژێ یەکسانە، چونکە ئەبو قەتادە {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: لە ساڵی غەزای حونەیندا، لەگەڵ حەزرەتدا {دروودی خوای لەسەربێ} دەرچووین، کاتێ بەرەنگاری ناموسوڵمانەکان بووین لە سەرەتاوە موسوڵمانەکان زاڵ بوونوسەرێ دوان سەرکەوتن، پیاوێکم دی لە بتپەرستەکان پیاوێکی موسوڵمانی دابوو بەزەویداو لەسەری دانیشتبوو دەیویست بیکوژێ، منیش سوورێکم بۆی خواردو لە پشتیەوە بۆی چووم‌و شمشێرێکم ماڵی بەسەر نەڕەی شانیدا گەیاندمە سەر جێگەی کاریگەری، لەگەڵ ئەوەیشا پەلاماری دامو باوەشی پیاما کردو بە گوشینێکی وا گوشیمی مردنم بە چاوی خۆم دی، بەڵام دوا ئەوە کەوتە گیانەڵاو تلیسایەوەو منی بەردا، بەرە بەرە سوپای ئیسلام شکستیان تێ کەوت منیش رامکرد، لەرێ گەیشتم بە عومەری کوڕی خەطاب {رەزای خوای لێبێ} فەرمووی: ئەوە ئەو خەڵکە چییانە بۆچی وا شکان؟ گوتم: فەرمانی خودا وابوو، چارەنووسی خودایی رەتبوونەوەی نیە، لە پاشدا خەڵکەکە گەڕانەوەو شێرانەو مەردانە تێ هەڵچوونەوەو لە دەوری حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} وەك شورای پۆڵایین ئاخڵەیان داو گۆی سەرکەوتنیان لە مەیدانا، بە هەڵمەتی پاڵەوانەیان، بە دوژمن بەجێ هێشتو ئاڵای هەمیشە سەربەرزو سەرکەوتووی موحەممەدیان دیسانەوە لە مەیدان شەکانەوە، جا لەپاش سەرکەوتن حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} دانیشتو فەرمووی: کەسێ لە غەزادا نا موسوڵمانێ بکوژێو بەڵگەی هەبێ لەسەر ئەوە، ئەوە با کەلوپەلو تفاقەکەی رووت بکاتەوەو

بیانبات بۆ خۆی. تا ئەوێ کە دەفەرموێ: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} تفاقی ئەو کوژراوەی دابەمن (ش/ د/ ت) (لە ئەصڵەکەو لە ئەصڵی ئەصڵەکەدا دەفەرموون: لە ساڵی فەتحی قەڵای خەیبەردا. بەزەینم ئەمە هەڵەیە، راستەکەی رۆژی غەزای حونەینە، وەك بەندە نوسیومە. بڕوانە: تاج/٨ ل — ١٤٨. کوردی تاج جلد/ ٤ ص ٣٨٢ عەرەبی. شەرحی صەحیحی موسلیم نەوەوی/١٢ ص ٥٧، عمدة القاری ج/ ١٥ ص ٦٨، عمدة القاری ج/ ١٧ ص ٢٩٩، اقتران النیرین بەرگی/ ٤ لاپەڕە/ ٢٨٩. بە بۆچوونی من لە کفایە الاخیارەکەدا هەڵەی نووسیارە، یا هەڵەی چاپە، لە دەست خەتەکەدا حنین باش نەنوسراوە بە خیبر چاپکراوە، دانەری فیقهولویەسەرەکەیش بەبێ تەحقیق روونووسی کردووە. والله أعلم — وەرگێڕ).

ئەگەر زیانیشی لە کۆڵ بخا وەك کوشتنی وایە، وەك ئەوە بە برینی زۆر کۆڵەواری بکا، یا ئەندامە سەرەکییەکانی پەك بخا، وەك ئەوە کوێری بکا، یا هەر دوو دەستی، یا هەردوو قاچی ببڕێ، لە هەلو مەرجی وادا تفاقو کەلوپەلەکەی هی خۆیەتی، لەسەر فەرموودەی رۆشنتر (الاظهر) ئەگەر دیلیشی بکا هەروایە، چونکە بەدیلکردنیش زیانی لە کۆڵ موسوڵمانان دەکەوێ، ئەگەر بە کۆمەڵێ بێبڕوایێ لە غەزادا بکوژن لە کەلوپەلەکەیدا دەبن بە هاوبەش.

## ٣٥٢) دابەشکردنیماڵی تاڵانی:

تاڵانی بە عەرەبی ناوی (غەنیمە)یە، لە غەنم وەرگیراوە کە بە واتا قازانجە، لە زاراوی شەرعی پیرۆزدا: ئەو ماڵەیە کە بەزۆر لە بێبڕوای شەڕکەر وەردەگیرێ، کە دادەنرێ بە دەستکەوتی جەنگ، خوای بەهۆی کوشتارەوە بێ، یا بەهۆی غاردانی ماینو ئەسپو وشترو هێسترو گوێرێژو پاپۆڕو ئوتومبێلو شتی تری واوەبێ، لە هەموو جۆرە کە رستەو تفاقی تری جەنگ. بە وشەی (شەڕکەر) ماڵی پاشگەز دەردەچێ، چونکە ئەوە بە مفتە ماڵ (فەیأ) دادەنرێ، نەك بە تاڵان، بنەمای سەر بەڵگە بۆ تاڵانی ئەم ئایەتەیە (واعلموا انما غنمتم من شئ فان لله خمسه وللرسول – ئەنفال – ٤١/٨) واتە: ئەی گەلی ئیسلام! ئەو تاڵانییەی کە بە جەنگ وەریبگرن لە بێبڕواکان، چ کەمی چ زۆری، ئەوە پێویستە کە پێنجیەکی بەش بکەنەوە بەم دەستوورە کەوا دێ: پێنجیەکی ئەو پێنجیەکە بۆ خوداو پێغەمبەر).

پشکی پێنج یەك لە سامانی تاڵانی جیا دەکرێتەوەو ئەو چوار پێنج یەکەکەی تری بەسەر جەنگاوەرەکانا لەسەر ئەم یاسایە دابەش دەکرێ: یەك پشك بۆ پیادەو سێ پشك بۆ سوار، چونکە پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) لە غەزای خەیبەردا ئاوای کردووە، ئەم سێ پشمە کە دەدرێ بە سوارە بەشی دیاریکراوی خۆیەتی، لەبەر ئەوە یەك ماینی پێ بێ یا زیاتر ژمارەی پشکی بۆ زیاتر ناکرێ. چونکە لە رۆژی خەیبەردا زوبەیر چەند ماینێکی پێ بوو لەگەڵ ئەوەیشدا پێغەمبەر بەشی یەك ماینی پێی دا (ئیبنو ماجە) لە گێڕانەوەیەکی ئەبو داووددا: یەك پشك بۆ

پیادەو سێ پشك بۆ سوارە، دوو پشك بۆ ماینەکەی ژێری‌و پشکی بۆ خۆی. لە گفت (لەفظ)ێکی بخاریدا: دو پشکی بۆ مایین دادەناو یەك پشك بۆ خاوەنەکەی.

## مەرجی ئەو کەسەی شایانی ئەم بەشە پشکەیە:

**مەرجی یەکەم:** ئیسلامە، بێبڕوا پشکی نیە، بەڵام ئەگەر بە فەرمانی پێشەوا ئامادەی شەڕکردن بوو سووکە بەشێکی پێ دەدرێ، چونکە جوولەکەکانی بەنی قەینوقاع، لە شەڕدا یارمەتی پێغەمبەریان دا، لەسەر داوای خۆی {درودی خوای لەسەربێ} لە دواییدا لە دەسکەوتی جەنگ سووکە بەشێکی پێیاندا، ئەگەر بەبێ فەرمانی پێشەوا لە خۆیەوە ئامادەی جەنگ بوو هیچی پێ نادرێ، ئەو سووکە بەشە شتێکە ناگاتە پشکی پیادە. پێشەوا بەکۆششی خۆی ئەندازەی بەپێی شوێن بۆ دادەنێ، بۆ وێنە زیاتر بە شەڕکەر دەدا هەتا کەسێکی تر، زیاتر بە شەڕکەرێ دەدا کە زیاتر شەڕبکا هەتا ئەو کەسەی کە کەمتر شەڕبکا، هەروا زیاتر بە سوار دەدا لەچاو پیادەدا، زیاتر بەو ژنە دەدا کە تیماری زامار دەکا لە چاو ئەو ژنەدا کە ئاگاداری تفاقیان دەکا. ئیتر بەپێی سوودو قازانجی خاوەنی سووکە بەش بەشی بۆ زۆرو کەم دەکرێ.

**مەرجی دووەم:** ڕەسیدە بوونە، منداڵ پشکی نیە، گەرچی پێشەوایش ڕێگەی پێ دابێ، بەڵام چکێکی پێ دەدرێ، چونکەهەرچۆن بێ هەر قازانجێکی هەیە، هەر هیچ نەبێ ئارمایی موسوڵمانانی پێ پتر دەبێ‌و قەرەباڵغییان زۆر دەکا. فەرمایشتی شافیعی {رەزای خوای لێبێ} وا دەگەیەنێ، کە پێغەمبەر خۆی {درودی خوای لەسەربێ} چکێکی پێ داوە، بەڵام

پشك بۆ منالْ دانانرێ، چونكه لەو دەستەیە نیە كە غەزاكردن لە سەریان پێویستە (چك: شتێ كەم: سووكە بەش).

**مەرجی سێیەم:** ئازادییە، لەبەر ئەوە بەندە پشكی نیە، چونكە ئەمیش لە دەستەی پێویستبوونی جەنگ نیە، بەڵام چكێكی پێ دەدرێ، چونكە هەم سوودی هەیە، هەم تارمایی موسوڵمانان لەبەر چاوی بێبڕوایان پتر دەكا، لەبەر ئەوەیش كە پێغەمبەر خۆی {دروودی خوای لەسەربێ} لە رۆژی خەیبەردا لە دەستكەوتی جەنگ چەكێكی دا بە عومەیری بەندەی ئەبو لەخم. (تیرمیذی گێڕاویەتەوە، وە دەفەرموێ: فەرموودەیەكی جوانی ساغە) (چكپێدان واتە: رەضخ – وەرگێڕ).

**مەرجی چوارەم:** هۆشی ساغە، شێت پشكی نیە چونكە لەو دەستە نیە كە غەزاكردن پێویستە لەسەریان لەسەر قسەی ئیمامی ماوەردی {رەحمەتو رەزای خودای لێبێ} پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} چكێكی بە شێت داوە.

**مەرجی پێنجەم:** نێرینەییە، ژن پشكی نیە، چونكە ئەویش لە دەستەی پێویستبوونی غەزا نیە، بەڵام لە دەسكەوتی جەنگ سووكە بەشی پێ دەدرێ، مێردی ببێ یا نەیبێ یەكسانە، چونكە ئیبنو عەبباس لەو نامەیەدا كە وەڵامی نەجدەی حەرووری تیادا داوەتەوە دەفەرموێ: (بەڵێ پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} ژنانی دەبرد بۆ غەزا، ئەركیان ئەوەبوو تیمارو دەرمانی زامارەكانیان دەكرد، لە تاڵانیش بەخشیشی دەدانێ، بەڵام وەك پیاوان پشكیان بۆ دانەدەنرا) (م/ د/ ت/ ن).

ئەم چوار پێنجیە كە ئاوا وەك باسكرا دابەش دەكرێ پێنج یەكەكەی تریش ئاوا دابەش دەكرێ: دەكرێ بە پێنج بەشەوە، پشكێكی

هی پێغەمبەر خۆی بووە لەکاتی ژیانی خۆیدا، بەپێی ئایەتی (فان لله خمسه وللرسول) تەنیا بۆ پیرۆزی لە سەرەتای ئەم پشکەوە ناوی خودا هێنراوە، یا بۆ ئەوە کە بزانرێ کە ئەم پشکە تایبەت نیە بە کاتی ژیانی پێغەمبەرەوەو بەس، بە جۆرێکی وا کە لەپاش مەرگی خۆی تەواو بێ، بەڵکوو لە پاش خۆشی بۆ بەرژەوەندی موسوڵمانان خەرج دەکرێ، چونکە عەمری کوڕی عەبەسە {ڕەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: پێغەمبەر {دروودی خودای گەورەی لەسەربێ} جارێ لەلای وشترێکا — لەماڵی تالآنییەکە — نوێژی بۆ کردین، کە سلاوی دایەوە تەڵێ تووکی لە تەنشتی وشترەکە هەڵگرتو فەرمووی: پێنج یەکی لێ دەرچێ ئائەم تەڵەمووە چییە، لە دەستکەوتی ماڵی تالآنی ئێوە بە من حەلاڵ نیە، لە هەمان کاتا ئەو پێنج یەکەیش دیسان هەر دەگەڕێتەوە بۆ خۆتان. دەی ئەو پێنج یەکە کاتێ دەگەڕێتەوە بۆ گشت موسوڵمانان، وەك فەرموودەکە دەفەرموێ، کە خەرجبکرێ بۆ بەرژەوەندی گشتی، کە گرنگترینیان قایمکردنی کەلێنەکانی سەر سنوورە، چونکە هۆی پاراستنی سەرو ماڵو نامووسی هەموو موسوڵمانانە، لە پاش ئەویش هەرکارێ گرنگتربێ پێشتر دەخرێ.

**پشکی دووەم:** دەدرێ بە خزمانی پێغەمبەر {دروودی خودا لە خۆیو ڕەزای خودا لە خزمانی بێ} کە لە نەوەی هاشمو لە نەوەی موطەللیب بنو بەس، لێی نادرێ بە کەسی تر، بەپێی فەرموودەکەی جوبەیری کوڕی موطعیم {ڕەزای خوای لێبێ} کە دەفەرموێ: منو عوسمانی کوڕی عەففان چووینە خزمەتی حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} عەرزیمانکرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! لە پێنج یەکی پێنج یەك (واتە: لە خۆمسولخومس) بۆچی بەشی بەرەبابی بەنی موطەلیبو بەرەبابی بەنی هاشم دەدەی کەچی بەشی

ئێمە نادەی، وەلحاڵ ئێمەو ئەوان هەرسێ لامان بۆ تۆ یەکین‌و بۆ خزمایەتی لە یەك پایەداین؟ فەرمووی {دروودی خوای لەسەربێ}: ئاخر بەرەبابی بەنی موطلەلیب‌و بەرەبابی بەنی هاشم یەك شتن، لەبەر ئەوەی کە لە سەردەمی پێش هاتنی ئیسلام‌و لە دوا هاتنی ئیسلامەوە پشتی یەکیان گرتووەو پشتی یەکیان بەرنەداوە. جوبەیر فەرمووی: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} هیچ بەشی دانەنا بۆ بەرەبابی بەنی عەبدولشەمس‌و بۆ بەرەبابی بەنی نەوفەل. (بوخاری) جوبەیر خۆی لە بەرەبابی نەوفەلە، عوسمانیش لە بەرەبابی عەبدوشەمسە، پێغەمبەریش لە بەرەبابی هاشمە. هاشم‌و موطلەلیب‌و نەوفل‌و عەبدوشەمس چوار برابوون، هەر چواریان کوڕی عەبدومەنافن. ئەم پێنج یەکە وەك کەلەپوور بەش دەکرێ بە سەریانا، دوو بەش بۆ نێرینەیان‌و یەك بەش بۆ مێیینەیان..

**پشکی سێیەم:** دەدرێ بە هەتیوی هەژار، چونکە ئەم پشکە دانراوە بۆ ئەوان هەتا گوزەرانی پێ بکەن بۆ هەتیوی دەوڵەمەند نیە، چونکە دەوڵەمەندیی هەتیو بۆ گوزەران لە باوك بەهێزترە، دەی لە شوێنێ منداڵ لەگەڵ باوکی هەژارا کە لەماڵ کەم هێزترە لەم پشکە بەشی نەدرێ ئیتر چۆن خۆی دەوڵەمەند بێ بەشی دەدرێ.

**پشکی چوارەم:** دەدرێ بە هەژاران، بەپێی ئایەتە پیرۆزەکە، چونکە هەژاریش بەر وشەی (مسکێن) دەکەوێ، کە لە دەقی ئایەتەکەدا هاتووە.

**پشکی پێنجەم:** دەدرێ بە ڕێبوار، بەپێی ئایەتە پیرۆزەکە، دەق وەك زەکات بەپێی ئەندازەی پێویستی سەرف دەکرێ بۆیان، مەرجە

لەکاتی بەشپێداندا رێبوارە کە پێویستی پێی هەبێ، وەك ئەوە پارەی لێ برابێ.

## ٣٥٣) مفتە ماڵ (مال الفیئ):

مفتە ماڵ بە عەرەبی ناوی فەیئە، لە زمانا لە وشەی (فاء) وەرگیراوە کە بەواتا (گەڕایەوە)یە. لە شەرعا ئەو سامانەیە کە بەبێ شەڕو شۆڕ لە کافران دەسێنرێ، وەك ماڵێ لە ترسی موسوڵمانان بە جێیان هێشتبێ، یا وەك سەرانەو خەراج، یا وەك ئەو ماڵەی کە لە پەیماندارێکی مردووی بێ کەلەپوورگر، بەجێ مابێ، یا هەر ماڵێکی تری وا، یا وەك ماڵی پاشگەز، لە پاش کوشتنی، یا لەپاش مردنی، جا ئەم مفتە ماڵەیش دەکرێ بە پێنج پشکەوە، پێنج یەکی دەدرێ بەو تاقمانەی کە لە باسی تالانیدا رابوردن. ئەو چوار پێنج یەکەکانی تری لەگەڵ پێنج یەکی پێنج یەکی تالانی جەنگا هینی پێغەمبەر بوون لەکاتی ژیانی خۆیدا، کەرەستەی جەنگی پێ ئامادە دەکرد بۆ چاو ترساندنی دوژمن، بەڵام لە پاش خۆی مووچەی سەربازەکانی سوپای لێ دەدرێ، کە پێشەوا ئامادەیان دەکا بۆ غەزاکردن، کە ناویان لە دیوانی دەوڵەتا تۆمار دەکرێ، بە مەرجێ ئەم مەرجانەیان تیادا بێ: ئیسلامو ئەرکداری (تەکلیف)و ئازادیو لەشساغی، چونکە بەم جۆرە کەسانە دوژمن چاوترسێن دەبێو زیانی دوور دەکەوێتەوە، جا پێشەوا چوار پێنج یەکەکەیان بەسەردا دابەش دەکا بەپێی پێداویستی خۆیان، بەڵام مەرج نیە بە یەکسان دابەش بکرێ بە سەریانا، بەڵکوو دروستە مووچەی برێکیان پتر بێ لە مووچەی برێکی تریان. جا پاش ئەمە ئەگەر شتێکی لێ مایەوە خەرج دەکرێ بۆ بەرژەوەندەکانی تری

موسـولّمانان، لـه چەشـنی تـازە کردنـەوەو قـایمکردنی قـەڵاکانو پـڕ کردنەوەی کەلێنی سەر سنوورەکانو کڕینی چەكو شتی تری وا.

## ٣٥٤) بڕیارەکانی سەرانە (الجزیه):

جزیه وشەیەکی عەرەبییە، بە کوردی نـاوی سـەرانەیە، لـە زمانـا بـەو باجـە دەگـوترێ کـە لەسـەر پەیمانـدارەکان دانـراوە، بۆیـە پێـی دەگوترێ جزیە، چونکە جزیە بە واتـا لـە جیـاتیو برێتـی کەوتنـە، لـەم شوێنەیشدا سەرانەکە، لە جیاتی کوشـتنی خاوەنەکەیـەتی، چـونکە ئـەم سـەرانەیە بەرامبـەر بەوەیـە کـە ئێمـە وازیـان لێ بهێـنین! لـە شـەرعا: گرێدانێکی تایبەتە: بێبڕوا لە ئەستۆی خۆی دەگرێ. بەر لـە یـەکگرتن سـەربەڵگەی ڕەوا بـوونی سـەرانە ئـەم ئایەتەیـە: {قَـاتِلُواْ الَّـذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَلاَ بِالْيَوْمِ الآخِرِ وَلاَ يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللّهُ وَرَسُولُهُ وَلاَ يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ حَتَّى يُعْطُواْ الْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ – سورة التوبة – ٢٩/٩} واتـە: جـەنگ بکـەن لەگـەڵ ئـەو کەسانەدا کـە ئیمـانو بـاوەڕی ساخیان بـە خـوداو بـە ڕۆژی دوایـی نیـە، چـونکە ئـەوەی کـە خـوداو پێغەمبـەری خـودا قەدەغـەیان کـردووەو بـە حـەرامی دادەنـێن ئـەوان ئـەوە بـە حـەڵاڵ دادەنـێنو بـە حەرامی نازانن و ڕەفتار ناکەن بە ڕەفتـارێکی وا کـەڕێکی یاسـای خـودایی بێ، ئەو کەسانەیش وەك ئەو جوولەکـەو گاورانـە کـە نامـەی ئاسمانییـان بۆ هاتووە، بەڵام گۆڕیویانەو دەستکارییان کردووە، دەی بەردەوام جـەنگ بکـەن لەگـەڵ ئەمانـەدا هـەتا بـە ملکەچی بـە دەسـتی خۆیـانو بەسـەر شۆڕی سەرانەتان دەدەنێ).

ئەو رەحمانی کوڕی عەوف {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: پێغەمبەر خۆی {دروودی خوای لەسەربێ} سەرانەی لە ئاگر پەرستەکانی وڵاتی هەجەر وەدەگرت. (ب/ د/ ت) حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} دەیفەرموو: رێك وەك خاوەن نامەکان رەفتاریان لەگەڵدا بکەن (بوخاری) پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} سەرانەی لە خەڵکی نەجران وەردەگرت (ئەبو داوود) هەروەها لە خەڵکی ئەیلەیش سەرانەی وەردەگرت. حیکمەتی وەرگرتنی سەرانە ئەمەیە: بۆ ئێمە دەبێ بە مایەی کۆمەکی‌و یارمەتی، بۆ ئەوانیش دەبێ بە مایەی سەرشۆڕی‌و ریسواکردن، دووریش نیە کە بەرەبەرە ئەو سەرانەیە ببێ بەهۆی ئیسلام بوونیان.

**بزانە:**

پەیمانبەستن لەگەڵ ئەمانەدا دەبێ هەر لەگەڵ پێشەوادابێ، ئەگەر لەگەڵ خۆی یا لەگەڵ جێداری ئەودانەبێ دانامەزرێ، چونکە شتی وا لە بەرژەوەندە هەرە گەورەکانە، لەبەر ئەوە دەبێ لەگەڵ کەسێکابێ کە مافی رەچاوکردنی گشتیی هەبێ!

## ٣٥٥) مەرجەکانی پێویستبوونی سەرانە:

**ئەم پێنجەن:**

**یەکەم:** رەسیدە بوون، منالْ سەرانەی لەسەر نیە.

**دووەم:** هۆشی ساغ، شێت سەرانەی لەسەر نیە چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} کە موعاذی نارد بۆ سەر یەمەن پێی فەرموو: کە لە

هەموو سەرێ کە رەسیدە بووبێو موکەللەف بێ دیناری سەرانەی لێ بسێنێ. دەی چەمكو مەفهوومەکەی ئەوەیە: کە سەرانە لەسەر منالو شێت دانانرێ، لەبەر ئەوەیش چونکە منالو شێت بەبێ سەرانەیش گیانیان پارێزراوە.

**سێیەم:** ئازادییە، کەواتە سەرانە لە کۆیلە وەرناگیرێ، بەپێی فەرموودەکەی عومەر {رەزای خوای لێبێ} کە دەفەموێ: کۆلە سەرانەی لەسەر نیە. ماوەردی ئەم فەرموودەیەی بە فەرمایشتی پێغەمبەرداناوە. لەبەر ئەوەیش چونکە کۆیلە خۆی ماڵە، ماڵیش سەرانەی لەسەر نیە، پاش مەرگەو بەندەی بەش بەشو کاغەز پێدراویش لەم لایەنەوە وەك کۆیلە وان سەرانەیان لەسەر نیە.

**مەرجی چوارەم:** نێرینەییە، سەرانە لەسەر ژن نیە، بەپێی ئایەتی {قَاتِلُواْ الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِاللّهِ} تاکۆتایی ئایەتەکە کە تۆزی لەمەوپێش رابورد. ژن بەر ئەمە ناکەوێ چونکە عومەر {رەزای خوای لێبێ} نامەی نووسی بۆ سەر لەشکرەکانی: سەرانە دابنێن لەسەر پیاوان، سەرانە دامەنێن لەسەر ژنو منال. لەبەر ئەوەیش کە ژن خۆی بەبێ سەرانەیش خوێنی پارێزراوە، لە لایەکی تریشەوە ژن خۆشی هەرماڵە، ماڵیش سەرانەی لەسەر نیە.

**مەرجی پێنجەم:** ئەوەیە ئەو کەسەی کە عەقدی جزیەی بۆ دەکرێو سەرانەی لێ وەردەگیرێ دەبێ یەکێ بێ لەمانە: لە خاوەن نامەکان بێ، یا شوبهەو گومانی خاوەن نامەیان لێ بکرێ، گاورو جوولەکە خاوەن نامەن، ئاگر پەرستیش شوبهەی ئەوەیان لێ دەکرێ کە

کاتی خۆی پێغەمبەرو نامەیان بووە، بەڵام بە تێپەڕ بوونی ڕۆژگار دینەکەی خۆیان تێکداوە.

چونکە پێغەمبەر خۆی {درودی خوای لەسەربێ} سەرانەی لە ئاگر پەرست وەردەگرت وە دەیفەرموو: ڕێك وەك خاوەن نامەکان حیسابیان بۆ بکەن و چ ڕەفتارو مامەڵەیێ لەگەڵ خاوەن نامەکان دەکەن هەمان ڕەفتاریش لەگەڵ ئاگر پەرستەکان بکەن. بەڵام ئەوانەی کە نە نامەیان هەیەو نە گومانی خاوەن نامەییان لێ دەکرێ سەرانەیان لێ وەرناگیرێ، ئەوانە یا دەبێ موسوڵمان ببن یا دەکوژرێن، چونکە خوای گەورە فەرمان دەکا کە جگە لە قەبووڵی ئایینی ئیسلام هیچی تر لەهاو بەشپەیداکەران قەبووڵ ناکرێ وەك دەفەرموێ: {فَاقْتُلُواْ الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَاحْصُرُوهُمْ وَاقْعُدُواْ لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ الصَّلاَةَ وَآتَوُاْ الزَّكَاةَ فَخَلُّواْ سَبِيلَهُمْ إِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ - سورة التوبة - ٥/٩} واتە: ئەوجا لەهەر کوێ ئەم هاوبەشکەرانە بەر هەوێڵتان کەوتن دەستیان لێ مەپارێزن بیان کوژن‌و بیان گرن‌و تەنگیان پێ هەڵچنن‌و لە هەموو لایەك بۆ سەیان بۆ بنێنەوەو ژیانیان لێ تاڵ بکەن‌و مەهێڵن هاتوچۆو ئاڵوێڵ‌و مامەڵە بکەن، جا ئەگەر تۆبەیان لە کوفر کردو نوێژەکانیان بەرێکوپێکی کردو زەکاتیان دا ئیتر ئابڵۆقەیان لەسەر لابەرن‌و ڕێگەی ژیانی ئاساییان بدەن‌و وەك خۆتانیان تەماشا بکەن، لە ڕاستیدا خودا تاوانپۆش‌و خاوەن ڕەحمەتە). ئەمانە وەك بتپەرست‌و ڕۆژ پەرست‌و مانگپەرست‌و وێنەی ئەمانە، پاشگەزیش سەرانەی لێ وەرناگیرێ، یا تەوبە دەکا یا دەکوژرێ.

## ٣٥٦) ئەندازەی سەرانە (مقدار الجزية):

لای کەمی سەرانە دینارێکە، کە برێتییە لە مسقاڵی ئاڵتوون، دادەنرێ لەسەر هەژاری کاسپکار، کە ساڵی جارێ ئەو سەرانەیێ بدا، لەسەر پیاوی میانەی نەهەژارو نە دەوڵەمەند ساڵی دوو دینارە، لەسەر پیاوی دەوڵەمەند چوار دینارە. ئەمە سەر مەشقی ئیمامی عومەرە {رەزای خوای لێبێ} ئەوەبوو کە عوسمانی کوڕی حنیفی نارد بۆ سەر کووفە فەرمانی پێکرد کە بەم شێوەیە سەرانە لە ناموسوڵمانەکان وەربگرێ: لە دەوڵەمەند چلو هەشت درەم، کە دەکاتە چوار دینار لە پیاوی میانە بیستو چوار درەم، لە پیاوی هەژار دوازدە درەم، کە دەکاتە دیناری. بایەخ بە دەوڵەمەندیو هەژاری بەپێی کاتی وەرگرتنی سەرانەکەیە نەك بەکاتی بەستنی پەیمانی سەرانەکە. بەڵگەیەکی تریش هەیە لەسەر ئەوە کەلای کەمی سەرانە دینارێکە ئەویش ئەمەیە: کاتێ حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} موعاذ دەنێرێ بۆ سەر وڵاتی یەمەن فەرمانی پێدەکا: کەلە هەموو پیاوێکی رەسیدەی هۆشیار ساڵی دیناری سەرانە وەربگرێ، یا بایی دیناری مەغافیری وەربگرێ. مەغافیری جۆرە جلو بەرگێکە لە گوندێکی یەمەن دروست دەکرا ناوی مەغافیر بوو، وەك چۆن لە وڵاتی خۆمان دەگوترێ: شاڵی هەورامان، یا رانكو چۆغەی شاربازێڕ (حەدیثەکە ئەبو داوودو تیرمیذی گێڕاویانەتەوە. تیرمیذی دەفەرموێ: فەرموودەیەکی جوانی دروستە، حاکمیش دەفەرموێ: فەرموودەیەکی دروستە بەپێی مەرجی هەردوو پیرە).

سوننەتە بۆ پێشەوا کە لە پەیماننامەکەدا، لە پاش بڕیاردانی ئەندازەی سەرانە بە دینار، مەرجی ئەوەیشیان لەگەڵدا بکا: کە میوانداریی بەو موسوڵمانانە بکەن کە بە ناویان تێ دەپەڕن بۆ ئیش و کارو غەزاکردن و شتی تری وا، چونکە پێغەمبەر خۆی {دروودی خوای لەسەربێ} ساڵی سێ سەد دیناری لەسەر گاورەکانی ئەیلە دانا، کە خۆیان سێ سەد پیاو بوون، وە مەرجی ئەوەیشی لەگەڵداکردن کە تا سێ رۆژ میوانداری بەو موسوڵمانانە بکەن کە لە لایەنەوە تێپەڕ دەکەن، وە ناپاکیش لە هیچ موسوڵمانێ نەکەن. عومەریش {رەزای خوای لێبێ} پەیماننامەی سەرانەی بۆ خەڵکی شام نووسی، مەرجی ئەوەی لەگەڵدا کردن کە تاسێ رۆژ مافی میوانداری رابگرن. وەکی تریش ئەم میوانداریییە قازانجی موسوڵمانانی تیادایە بە تایبەتی هی هەژارەکانیان کەواتە سوننەتە.

بەڵام میوانداری تەنیا ئەرکی سەرشانی دەوڵەمەندو میانەیە، هەژار میوانداری لەسەر نیە، چونکە ناو بەناو دووبارە دەبێتەوە، لەبەر ئەوە پێی هەڵناسووڕێ. لە سێ رۆژیش نابێ پتر بێ چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: میوانداری هەتا سێ رۆژە، لەوە زیاتر خێر پێکردنە.

## بەستنی پەیمانی سەرانە:

کە تەواو بوو، ئەمانەی بەدوادا دێ: واتە ئەرکی سەرشانی ئێمەو ئەوان لە پاش دامەزراندی سەرانە ئەمانەن:

**یەکەم**: ئەوەی کە لەسەر ئێمەیە ئەم دوو شتەیە:

١) نابێ دەست بەرین بۆ سەرو ماڵیان، چونکە ئەو سەرانەیە بۆیە دەدەن هەتا سەرو ماڵی خۆیان بپارێزن‌و کەس بە ناڕەوا دەست نەبا بۆ سەرو ماڵیان، نابێ ئارەق‌و بادەیان بفەوتێنین، مەگەر ئاشکرای بکەن، هەر کەسێ بەبێ ئاشکراکردن بیفەوتێنێ پێی گوناهبار دەبێ، بەڵام بژاردنی لەسەر نیە، چونکە ئارەق نرخ‌و بەهای نیە.

٢) لەسەر پێشەوای موسوڵمانانە دەفعی دوژمنی خۆیانیان لێ بکا، خوای ئەو دوژمنەیان لە دەستەی جەنگ بن، یا لە پەیمانداران بن، یا لە موسوڵمانان بن، ئەمە بە مەرجێ کە لەناو وڵاتی ئیسلاما بن، یا خۆیان بە تەنیا لە شارێکا بن لە پەنای ئێمەدا.

دووەم: ئەوەی کە لە ئەستۆی ئەوانیشە ئەم چوار شتەیە:

١) سەرانەکەی سەریان بەرێك‌و پێکی بدەن، چونکە ئەمە جۆرە کرێیەکە کە لەسەر شێوەی سەر شۆڕی بۆیان، وەردەگیرێ لێیان، کە لەسەریانە بڕیارو ئەحکامەکانی ئیسلام لە ئەستۆ بگرن‌و رێزیان بگرن‌و بە سەریاندا جێبەجێ بکرێ، وەك لەخاڵی دووەمدا ئەم نوختەیە روون کراوەتەوە، دەی چی سەر شۆڕییەك لەوە سەختترە کە پیاو ناچار بکرێ شتێ لە ئەستۆ بگرێ کە خۆی بڕوای پێی نەبێ، بەڵگەی ئەم خاڵە ئەم ئایەتەیە: {حَتَّى يُعْطُواْ الْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ}.

وەلێ نابێ لەسەر شێوەی توندو تێژی‌و سزادان‌و کەساسکردن سەرانەیان لێ وەربگیرێ، شتی وا نادروستە. چونکە ئیمامی موسلیم {رەزای خوای لێبێ} دەگێڕێتەوە: هیشامی کوڕی حەکیم {رەزای خوایان لێبێ} لە شام بەلای تاقمێکا رەت بوو، لەبەر هەتاوی سوور راگیرابوون‌و رۆنی داخ

کرابوو بە سەرو گوێلاکیاندا، کە ئەمەی دی فەرمووی: ئەمە چییە؟ گوتیان: ئەوە لەسەر باجو سەرانە نەشکەنجەو ئازار دەدرێن! هیشام فەرمووی: شایەتی دەدەم کە زۆر باش بە گوێی خۆم ژنەوتم لە زاری پیرۆزی پێغەمبەر خۆشەویستو ئازیزو نازار دەیفەرموو: خودا سزاو ئازاری ئەوانە دەدا کە لە جیهانا سزاو ئازاری خەڵك دەدەن. ئیمامی شافیعی {رەزای خوای لێبێ} بە دەق بڕیاری داوە کە سەرانە بە نەرمونیانی وەردەگیرێ.

٢) دەبێ، ملکەچ بن بۆ بڕیاوی ئیسلام لە بارەی دەستەبەربوونی سەرو ماڵو ناموسەوە. ئەوانیش لە سەریانە هەرچی خۆیان بە حەرامی دەزانن نەیکەن، وە هەرچی خۆیان بە پێویستی دەزانن لە پاراستنی سەرو ماڵو ناموس بیکەن، تەنانەت ئەگەر کارێ وا بکەن کە خۆیان بە نادروستی بزانن، وەك داوێنپیسیو دزی، داری حەددیان لێ دەدرێ، چونکە ئەوان چوونەتە ژێر ئەوە کە یاسای ئیسلامیان بە سەردا جێبەجێ بکرێ، جارێ پیاوێکی جوولەکەو ژنێکی جوولەکەیان هێنا بۆ لای پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} داوێنپیسییان کردبوو، پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمانی کرد: بەردەبارانکران (ش) بەڵام ئەگەر کارێکی وا بکەن کە خۆیان بە نادروستی نەزانن، وەك ئارەق خواردنەوە، یا وەك ئەوە ئاگرپەرست ژنی خۆییو خوشکی خۆیان مارە دەکەن، ئەوە راجیایی هەیە لە جێبەجێکردنی حەدد لە سەریان، هەیە دەڵێ: بەڵێ لەم کاتەیشا حەددیان بە سەردا جێبەجێ دەکرێ، هەر وەك چۆن بەپێی مەذهەبی شافیعی ئەگەر حەنەفییەك خۆشاو (نەبیذ) بخواتەوە داری حەددی لێ دەدرێ گەرچی خۆشی بە حەڵاڵی دەزانێ، ئاوایش حەدد

لەسەر پەیماندار جێبەجێ دەکرێ ئەگەر شتێ بکەن لە ئیسلاما حەددی هەبێ، با خۆشیان بە دروستتی دابنێن! هەیشە دەڵێ: لەم کاتەدا حەددیان لەسەر نیە، چونکە ئەوان بەهۆی دانی سەرانەوە لەسەر کوفر موحاسەبە ناکرێنو رێگەی ئایینی پووچەڵی خۆیان لێ ناگیرێ، دەی کەواتە لەسەر شتێ کە بە حەڵاڵی بزانن باشتر موحاسەبە ناکرێن. لە راستیدا ئەم فەرمایشتە راسترە. جیایی نێوانی حاڵی ئەمانو حاڵی حەنەفییەك لەسەر خواردنەوەی خۆشاو حەددی لێ بدرێ ئەمەیە: ئەو مەبەستە بەرزەی کە لەبەر ئەو حەدد لە بادەنۆش دەدرێ لە خۆشاویشا هەمان مەبەست هەیە، چونکە حەنەفی بە حەدد لێدان چاوترسێن دەبێ، بە پێچەوانەی پەیماندار، چونکە ئەم بۆیە دەیخواتەوە بە دروستی دەزانێو دایدەنێ بە دین قایمی! وەلێ هەر چۆن بێ، مافی ئەوەیان نیە کە ئارەق بە بەرچاوی ئێمەوە بە ئاشکرا زەقنەمووت بکەن، دەی ئەگەر کاری وا ناشایستە بکەن تەمێ دەکرێن!.

٣) دەبێ پەیمان بدەن کە بەهیچ جۆرێ ناوی ئایینی ئیسلام نەهێنن مەگەر بەچاکە، قەدەغە دەکرێن لەوە کە تانە لە ئیسلامو لە قورئان بدەن، دەبێ بە تایبەت ئەوە لە ئەستۆ بگرن کە بە هیچ شێوەیێ ناوی سەروەری پێشینانو پاشینان حەزرەتی موحەممەد بە خراپە نەهێنن، جا ئەگەر نامەقووڵی وایانکرد، یا جنێویان بە پێغەمبەرێ لە پێغەمبەرەکاندا ئەوە تەمێ دەکرێن، پەیمانەکەیشیان هەڵدەوەشێتەوە ئەگەر لە خودی پەیمانەکەدا دەقی وا هەبوو کە لە سەر شتی وا هەڵبوەشێ. هەروەك لە سەریان پێویستە کە بە ئاشکرا کردارو گوتاری ناشایستە نەکەن، وەك مەسەلەی فرەخوایی لە وێنەی ئەم

قسەیان کە خودا لە قورئانا لەسەر زمانی ئەوان دەیگێڕێتەوە بۆمان: {إِنَّ اللَّهَ ثَالِثُ ثَلَاثَةٍ – سورة – ٧٣/٥} واتە: عیسا خودایەکەو مەریەمیش خودایەکەو خودایش خودایەکە، عیسا یەکەمی ئەو سێ کەسەیە، مەریەم دووەمی ئەو سێ کەسەیە، خودایش سێیەمی ئەو سێ کەسەیە!!).

هەروەها هەموو بیروباوەڕێکی تریان کە بە پێچەوانەی دەقی قورئانە، وەك ئەوە گوایە مەسیح و عوزەیر {درووددی خودایان لەسەربێ} کوڕی خوان!

{سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يَقُولُونَ عُلُوًّا كَبِيرًا – سورة الإسراء – ٤٣/١٧} واتە خودای گەورەو مەزن زۆر زۆر پاك و پیرۆزو بە دوورە لە وێنەی ئەم قسە بێ سەرو بنانەی کە ئەم بێبڕوایانە دەیڵێن لە بارەی زات و سیفاتی خواوە). جا ئەگەر بە راشکاوی شتێکی ناوایان کرد تەمێ دەکرێن و رێگەی ئەوەیان پێ نادرێ، بەڵام بەهۆی شتی واوە پەیمانەکەیان هەڵناوەشێتەوە.

٤) نابێ کارێکی وا بکەن زیانی موسوڵمانانی تیابێ، وەك ئەوە پەنای خەفیەو سیخوڕی دوژمن بدەن، هەتا جاسووسی بەسەر سەرو ماڵ و نامووس و هەست و نەستی موسوڵمانانەوە بکەن و نهێنییەکانیان ببەن بۆ ناو وڵاتی جەنگ، کە پێی دەگوترێ کافرستان، یا خۆیان ببن بە چاو ساغ بۆ دەستەی جەنگ و نهێنی و هەست و نەستی ئێمەیان پێ نیشان بدەن، یا رێگەی کفرو پاشگەز بوونەوە نیشانی موسوڵمان بدەن، یا موسوڵمانێ بکوژن، یا شتێ وا بکەن. جا لە هەموو ئەم شێوەکارانەدا

بەپێی ئەو کارەی دەیکەن شایانی چی حەددێ، یا چی تەمێ کردنێ ببن وایان لێ دەکرێ. ئەگەر کەسێکیان بەهۆی شەڕکردنەوە پەیمانەکەی هەڵوەشانەوە یەکسەر بەبێ مۆڵەتدان دەکوژرێ، ناگەیەنرێتە جێگەی لەخۆ ئەمین بوونی، چونکە لە کاتی وادا بەر بڕیاری ئەم ئایەتە ناکەوێ کە دەفەرموێ {ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ - سورة التوبة - ٦/٩} واتە: ئەوجا بێگەیەنەوە جێگەی ئەمینی خۆی) بەڵکوو بەر بڕیاری ئەم ئایەتەی تر دەکەوێ کە دەفەرموێ: {فَإِن قَاتَلُوكُمْ فَاقْتُلُوهُمْ - سورة البقرة - ١٩١/٢} واتە: ئەگەر ئەوان لە پێشا دەستیان کرد بە جەنگکردن لەگەڵ ئێوەدا ئێوەیش جەنگیان لەگەڵدا بکەن‌و بیانکوژن!).

تەنیا ئەوەندە هەیە لەم کاتەدا مافی پێشەوایە خۆی سەرپشك بێ لە نێوانی یەکێ لەم چوار شتەدا: کوشتن یا بە کۆیلەکردن، یا ئازادکردن بە پیاوەتی، یا تۆڵە لێ وەرگرتن بەماڵ لە جیاتی بەرەڵلاکردن، چونکە بوونەتەوە بە کافری بێ پەیمانی بێ ئەمان، لەکاتی جەنگیشدا پێشەوا خۆی سەرپشکە کە یەکێ لەم چوار رێگە چارەیە دەرحەق بە دیلی جەنگی بکا.

## ٣٥٧) نیشانەکردنی جل‌و بەرگیان:

ئەگەر ئەو پەیماندارانە لەناو وڵاتی ئیسلامدا بن لە سەریانە کە بە (غیار) خۆیان لە موسوڵمانان جیا بکەنەوە، غییار بریتییە لەوە پارچەیەك لە رەنگێکی جیا لە رەنگی جلەکانیان، بۆ نیشانە بدوورن بەسەر شانیاندا، یا بە شوێنێکی تریاندا، هەتا بناسرێن‌و بەپێی شانی

خۆیان رەفتاریان لەگەڵ بکرێ، هەتا لەلای سەرووی کۆڕو دانیشگەو دیوەخانەوە دانەنیشن‌و لە پێشدا سڵاویان لێ نەکرێ!.

چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} نەیی کردووە لەوە کە ئێمە لە سڵاو کردندا دەست پێشکەری بکەین، وەك دەفەرموێ: ئێوە لە پێشدا سڵاو لە جوولەکەو گاور مەکەن، ئەگەر لە رێگەی تەنگەبەریش تووشیان بوو خۆتان لەسەر چەقی رێگەکەوە بڕۆن‌و ئەوان ناچار بکەن کە بکەونە تەنگە بەرییەکەوە! (موسلیم‌و کەسانی تر گێڕاویانەتەوە) هەر تاقمەیەکیان خووی بەچی جۆرە جل‌و بەرگێکەوە گرتبوو هەر ئەوە لەبەر دەکا، بەڵگەی ئەمە ئەوەیە کە عومەر {رەزای خوای لێبێ} سەبارەت بە خاوەن نامەکان نامەی نووسی بۆ فەرماندارەکانی سەر شارە گەورەکان کە: مووی پێشە سەریان ببڕن‌و زوننار لەسەر جلەوە ببەستنە پشتیان، زوننار کشتەکێکی ئەستوورە دەکرێتە پشت وەك پشتێن. لەبەر ئەوەیش کە دیسان عومەر {رەزای خوای لێبێ} لەسەر ئەوەرێك کەوت لە گەڵیان کە نیشانە (غیار) بدرێ لە پۆشاکی بەریان، ئەمەیش بە ئاگاداری کۆمەڵێ لە هاورێکانی پێغەمبەر بوو {دروودی خودا لە پێغەمبەرو رەزای خودا لە یارانی} (بەیهەقی) سەرەڕای ئەمانەیش قەدەغەی ئەوەیان لێ ەکرێ کە سواری وڵاخی بەرزە ببن، چونکە خودای گەورە دەفەرموێ: {وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدْوَّ اللّهِ وَعَدُوَّكُمْ – سورة الأنفال – ٨/٦٠} واتە: ئەی موسوڵمانەکان! ئەی دۆستانی خودا! هەمیشە خۆتان! ئامادە بکەن بۆ چاری دوژمنەکانتان، ئەوەی کە دەتوانن لە هێزی جەنگ، لە فێربوونی هونەرەکانی، لە چەك‌و لە تفاقی، لە ئەسپ‌و ماین‌و هێستری مەشق

دیدەی قاڵو چوار ناڵ، ئەمانەو گشت کەرەستەیەکی تری جەنگ بەپێی کاتو شوێنو حاڵو توانا ئامادە بکەن، هەتا بە تەواوی دوژمنی خوداو دوژمنی خۆتانیان پێ چاوترسێنو تەمێ خواردوو بکەن) ئەوەتا خودای داناو زانا لەم ئایەتە پیرۆزەدا فەرمان بە دۆستانی خۆی دەکا کە رەوگەمایینی ئامادەو مەشق دیدە ئامادە بکەن بۆ تۆقاندنو چاوترساندنی دوشمنی خوداو دوژمنی خۆیان، جا شتێ مایەی بەهرەیەکی وا پیرۆزو گەورەبێ چۆن رێگە دەدرێ بە دوژمنانی خودا کە بەکاری بهێنن.

دیسان خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: هەتا رۆژی قیامەت لە کاکۆڵو یاڵی ولاخی بەرزە خێرو خۆشی گرێدراوە کە برێتییە لە پاداشی باشو لە ماڵی تالانی حەلاڵ. (ش/ د/ ت/ ن) دەی خێرو خۆشی لە کوێو بێبڕوا لە کوێ! لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێ: سەر پشتی ولاخی بەرزە جێگەی سەر بەرزیو سەرکەوتنە. دەی ئەمانە کەساسیو داماویو سەر شۆڕی بە بالایان براوە کە حاڵیان وابێ چۆن هۆی سەربەزییان دەخرێتە بەردە ست!.

**هەروەها هەڵگرتنی شێرو تیرو چەکیان لێ قەدەغە دەکرێ.**

## ٣٥٨) باسی نەچیرو سەربڕاوەکان:

نەچیر بە عەرەبی ناوی (صەیدە) بە واتا راوکراوە، وەك ئەم ئایەتە دەفەرموێ: {لاَ تَقْتُلُواْ الصَّيْدَ وَأَنتُمْ حُرُمٌ – سورة المائدة – ٩٥/٥} ئەی گەلی موسوڵمان! لەکاتی حەجو عەمرەکردندا بە بەرگی

ئیحرامەوە نەچیر مەکوژن. نەچیر لەم ئایەتەدا بە واتا گیانلەبەری راوکراوە. سەر بەڵگەی حەلاڵ بوونی نەچیر ئەم ئایەتەیە: {وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَاصْطَادُواْ – سورة المائدة – ٢/٥} واتە: وەکاتێ لە ئیحرامی حەجتتان بوونەوەو ئیحرامی حەجتان شکان دەتوانن راو بکەن وەك جاری جاران. فەرمانکردن بەراوکردن لەم ئایەتەدا حەلاڵبوونی راوکراوەکە دەخوازێ. ئەم فەرمانکردنە پێی دەگوترێ ئەمرێ ئیباحە، چونکە یاسایەکی ئوصوولی دەڵێ: فەرمانبە کردنی کارێ – لەپاش قەدەغەکردنی – بۆ رەوا بوونیەتی، کە کردنو نەکردنی یەکسا بێ.

## ٣٥٩) باسی سەربڕواکان (ذەبائیح):

ذەبائیح کۆی ذەبیحەیە بە کوردی واتە: سەربڕاو، سەر بەڵگەی دروستبوونی سەربڕاوەکان ئەم ئایەتەیە: {إِلاَّ مَا ذَكَّيْتُمْ – سورة المائدة – ٣/٥} واتە: ئەمانەی کە لەم ئایەتەدا باسکراون هەموویان حەرامن، مەگەر ئەوانەیان کە زوو فریایان بکەونو لە پێش ئەوەدا گیانیان دەربچێ سەریان ببڕن. چونکە وەك لە ئایەتەکە دەردەکەوێ: ئەم سەربڕاوانە لە کۆمەڵێ شتی حەرام جیاکراونەتەوە، کە لەم ئایەتەدا باسکراون: {حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالْدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللّهِ بِهِ وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلاَّ مَا ذَكَّيْتُمْ – سورة المائدة – ٣/٥} واتە: حەرام کراوە لە سەرتان مردارەوەبوو خوێنی رەوانو گۆشتی بەرازو خواردنی گۆشتی

ئەو گیانلەبەرانەی کە لەکاتی سەربڕینیاندا ناوی غەیری خودایان لێ هێنرابێ، وەك ئەوە لەباتی باسم الله بگوترێ باسم اللات والعزی، هەروا گۆشتی خنکاوو لێدراوو بەرەوەبوو لە شەڕە قۆچا کوژراوو دڕندە خواردوو، ئەمانە هەموویان حەرامن بێجگە لەوانەیان کە سەریان ببڕن.
دەی جیاکردنەوەی سەربڕاو لەوانە ئەوە دەبەخشێ کە سەربڕاو حەڵاڵە، گیانلەبەری حەڵاڵ دوو بەشە:

**یەکەم**: ئەوەیە کە لە بەردەستا بێ.

**دووەم**: ئەوەیە کە لەبەردەستا نەبێ، سەربڕینی بەشی یەکەم بەوە دەبێ بەشتێکی تیژ، جگە لە ئێسقانو نینوكو ددان، خوای چەقۆ بێ یا پارچە شووشە بێ، هەموو قوڕقوڕاچکەی کە هەناسەی پیا دێتو دەچێت، وە هەموو سوورێچکەی کە خواردنەوەو خواردەمەنیی پیادێتو دەچێ ببڕرین.

**بەشی دووەم**: کە ئەوەیە لەبەر دەستانەبێ، ئەوە لە جیاتی سەربڕینی ئەوەندە بەسە کە بریندار بکرێ بەشتێکی تیژی وا کە ئەندامی ببڕێ، چ لە ئاستی قوڕگیا بێ وە چ لە شوێنێکی تریا بێ، کە لەپاش ئەم برینداركردنە مرد وەك گیانداری سەر بڕاو وایەو گۆشتی دەخورێ. ئەمەیش وەك وشترێ بەلەسە بووبێو چنگی لێ گیرنەبێ، یا مەڕێ کەوتبێتە ناو بیرێکەوە، تێی ترنجابێ مەودای ئەوەی نەبێ بەزیندوویی دەری بهێنن، وەرێگەی سەربڕینیشی نەبێ (ابو العشر؟) لە باوکییەوە (رەزای خوایان لێبێ) دەفەرموێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆچی سەربڕین دەبێ هەر لە ئاستی قوڕقوڕاگەو لە بۆتەقەی ملدا بێ؟

فەرمووی: {دروودی خوای لەسەربێ} ئەگەر تێغێ بدەی لە رانیشی دەلا. (ئەبو داوود گێڕاویەتەوە). وە دەفەرموێ: ئەمە هەر بۆ بەرەوە بوو و ئاژەڵی بەلەسەبوو دروستە وای لێ بکرێ. لە صەحیحەیندا دەفەرموێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە سبەینێ بە دومن دەگەین، چەقۆیشمان پێ نیە، ئایا بە تەڵە قامیش‌و بە چەقۆی بەردین ئاژەڵ سەر ببڕین؟ فەرمووی: گورج بە، یا فەرمووی: دەستوبردی لێ بکەن تا لە چێر دەستتامردار نەبێتەوە، ئیتر بە هەرچی سەری دەبڕی باشە، بە مەرجێ فیچقە بە خوێن بکاو لەکاتی سەربڕیندا خوێنەکە بازەرەقە ببەستێ، وە ناوی خودای لێ ببرێ، وە بەمەرجێ ئەوشتە ددان‌و نینوك نەبێ ئەوە لێی بخۆ. تا ئەوێ کە دەفەرموێ: جا تالانی وشترو رانمان هێنا، وشترێ لە تالانییەکە تەرابوو، پیاوێ تێرێکی پێوەناو گلی دایەوە، بەو تیرە مرد، پێغەمبەریش {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمووی: هەندێ وشتر هەن سڵ‌و سرکن وەك جانەوەری کێوی سرك تۆڕن، جا ئەگەر شتی وا روویداو چارتان نەدەکرد وەك ئەمە ئاوای لێ بکەن. (ش/ د/ ت/ ن) مەرج نیە کە برینەکە کوشندە بێ، بەڵکوو برینێکی وا بەسە کە خوێنی لێ بێ‌و رێی تێ بچێ کە ببێ بەهۆی کوشتنی، تەنانەت ئەگەر سەگێ بکاتە گیانلەبەرێکی بەلەسە بەوەیش حەڵاڵ دەبێ، هەروا ئەگەر وشترێ بەربۆوەو لەناو بیرێکا ترنجا بەسەر وشترێکی تردا، رمێکی کردبە وشترەکەی سەرەوەدا لە وشترەکەی ژێرەوە دەرچوو، هەردووکیانی سمی، هەردوکیان حەڵاڵ دەبن، هەر وەك چۆن تیرێ بنێ بە نێچیرێکەوە، لێی بداو لێی دەرچێ‌و بدا لە نێچیرێکی تریش هەردوکیان حەڵاڵ دەبن.

**چۆنێتی سەربڕینی شەرعی:**

سەربڕینی گیانلەبەر لە شەرعا پێشی دەگوترێ: ذەکات کە لە زمانی عەرەبا بە واتا بۆنو بەرامەی خۆشو پاكو پوختییە، بۆیە واناو نراوە چونکە خواردنەکەی خۆشو ڕەوا دەبێ، زەکاتیش (واتە: سەربڕین) لە شەرعا بڕێتییە لە بڕینێکی تایبەتی، کە قوڕقوڕاچکەیو سوورێنچەکەی بە تەواوی ببڕێ، سورینچکە وا لەژێر قوڕقوڕاچکەوە، وا سوننەتە ئەو دوو شا دەمارانەیش ببڕێن کە وان لەم دیوو ئەو دیوی چوڕقوڕاچکەوە. مەرجی ئەو گیانلەبەرە کە سەردەبڕرێ ئەوەیە لەکاتی سەبڕینا گیانی تیابێ، جا ئەگەر گیانلەبەرەکە نەخۆش بوو هەر ئەوەندە بەسە با بە حاڵ نیمچە گیانێکی تیا مابێ، چونکە هۆیەکی تر نیە بۆ مردنەکەی، وە ئەگەر ساغ بوو دەبێ گیانێکی جێ گرتووی تیابێ کە نیشانەکەی ئەوەیە جمو جووڵو پەلە پەلێکی بەهێزی ببێ یا خوێنی بازرەقە ببەستێ، یا لەکاتی سەربڕینا دەنگ لە قوڕگیەوە بێو خوێنەکەی بە ئاسایی ڕەوان ببێ، کەواتە: ئەگەر دڕندە مەڕێکی زامارکرد، یا سەربانێ تەپا بەسەر ئاژەڵێکا، ئەگەر ژیانێکی جێ گرتووی تیا مابوو ئەوە حەڵاڵە دەنا ئەگەر لە پێش سەربڕینەکەیدا گەیشتبووە پەلەقاژەی مەرگو جمو جووڵی سەبڕاو ئەوە حەڵاڵ نیە. ئیبنو صەبباغ دەفەرموێ: ژیانی دامەزراو، کە پێشی دەگوترێ. ژیانی جێگرتوو، کە لە عورفو باوی شەرعا پێی دەگوترێ: حەیاتی موستەقیرە، ئەوەیە ئەگەر وازی لێ بهێنی دەوری ڕۆژێ بمێنێ، ژیانی دانەمەزراویش ئەوەیە دەسبەجێ بمرێ.

ئەگەر بزنێ گیایەکی ژەهرداری خوارد وەك کارووشە کێویلە، کە گیایەکی کوشندەیە، وە گەیشتە گیانەلا پێی، ئەوە بەسەر بڕین حەلاڵ نابێ، چونکە هۆیەك هەیە بۆ مردنەکەی جگە لەسەر بڕینەکە، کە کارووش خواردنەکەیە، وەك بریندارکردنی دڕندە.

## ٣٦٠) راوکردن بە گۆشتخۆرە مەشق دادراوەکان (الإصطیاد بالجوارح المعلمة):

بۆ زێدە سوودو بەهرە بڕوانە: تەجریدی بوخاری بە کوردی بەرگی/ ٥ ل – ١٦٦ زنجیرە/٧٥.

راوکردن بە دڕندە گۆشتخۆرەکان دروستە، وەك سەگو وێزو پڵنگو ئەمانە، هەروا بە مەلە گۆشتخۆرەکانیش وەك هەڵۆو شاهێنو باز، بەپێی فەرمایشتی زاتی مەزن: {قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ وَمَا عَلَّمْتُم مِّنَ الْجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ اللّهُ فَكُلُواْ مِمَّا أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ وَاذْكُرُواْ اسْمَ اللّهِ عَلَيْهِ – سورة المائدة – ٤/٥}
واتە: ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! پێیان بفەرموو: حەلاڵکراوە بۆ ئێوە هەموو خواردەمەنیو خواردنەوەیەکی پاكو خۆشو باش، هەروا ئەو نەچیرەیش کە ئەو دڕندەو پەلەوەرە راوکەرانە دەیانگرن بۆتان، کە مەشقتان پێ کردوون لەوەی کە خودا فێری ئێوەی کردووە، دەی بخۆن، لە گۆشتی ئەو نەچیرەی کە دەیگرن بۆتان، بەلام لەکاتی بەرەڵلاکردنی ئەو برینکەرە راوکەرانەدا بۆسەر نەچیرەکان ناوی خودا ببەن، بیسمیللا بکەن لەکاتی سەربڕینیاندا. ئیبنو عەبباس {رەزای خودا لە خۆی و لە باوکی}

دەفەرموێ: جەواریح بە سەگو باڵندەی تالیم دادراو دەگوترێ، لە (جەرج) وەرگیراوە، کە بە واتا (کەسب)ە، چونکەخاوەنەکانیان کاسپییان پێ دەکەن، ئەم ئایەتەیش بەم واتایە کە دەفەرموێ: (ویعلم ما جرحتم) واتە: (ما کسبتم) عەدی کوڕی حاتم {ڕەزای خوای لێبێ} فەرمووی: بۆ ڕاوکردن بە باز پرسیارم کرد لە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمووی: هەرچی دەگرێ بۆ تۆ بیخۆ. (تیرمیذی) دیسان عەدی فەرمووی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! من سەگی فێرە ڕاوم هەیە کە دەیانکەمە نەچیر دەیگرن بۆمن، وە لەکاتی بەرەڵاکردنیشیان ناوی خودا دەهێنم. فەرمووی: کاتێ سەگی فێرە ڕاوی خۆتت بەرەڵلا کردە گیانی نەچیرو ناوی خودات لێ هێنا ئیتر لە گۆشتی نەچیرەکە بخۆ، ئەگەر بیشی کوژێ هەر لێی بخۆ، ئەم نوسخەیەی وا لەبەر دەستی مندا لەم دوو حەدیثەی عەدی تێکەڵو پێکەڵ کراون، بەڵام من بەپێی کفایەکە ڕاستم کردەوە، فەرموودەی دووەم: شەیخان‌ونەبو داوودو تیرمیذیو نەسائی گێڕاویانەتەوە بڕوانە تاج/ ٤ ل – ٢٣ – وەرگێڕ) کەواتە: بەرەڵاکردنی دڕندەو باڵندە ڕاوکەرەکان بۆ سەر نەچیر، ئەگەر زاماری بکەن یا بیگرنو بیکوژن بری سەربڕینی دەکەوێ، خاوەنەکەی فریای سەربڕینیشی نەکەوێ هەر دروستە گۆشتی ئەو نێچیرە بخوا، زامەکەیش لەهەر کوێی بکا یەکسانە.

## مەرجی مەشق پێکردنیان:

ئەوەیە: کە ئەوەندە مەشقیکردبێ لە قسەی خاوەنەکەی دەرنەچێو بە قسەی بکا، ئەگەر کردیە نەچیرەکە بڕوا بۆی، ئەگەر تێی

خورێ که نەچێ بوەستێو بگەڕێتەوە، وە که نەچیرەکەی گرت هیچی لێ نەخوا، وە ئەم حاڵە ئەوەندە چەند بارە ببێتەوە کە مرۆڤ لەو باوەڕەدابێ که هەرگیز لە فەرمانی خاوەنەکەی دەرنەچێ. جا ئەگەر راوچییەکە بە زیندوویی پیا گەیشت ئەبێ سەری ببڕێ، ئەگینا گرتنەکەی لە جێی سەربڕینەکەیەتیو خواردنی دروستە، بەڵام ئەگەر یەکێ لەم مەرجانە فەوتان بەبێ سەر بڕین دروست نیە لێی بخورێ.

**ئامێری سەربڕین:**

سەربڕین دروستە بە گشت شتێکی تیژ، کە شت ببڕێ، خوای لە ئاسن بێ وەك کێردو چەقۆو شمشێرو رم، یا لە قورقوشم بێ، یا لە مس بێ، یا لە زێڕبێ، یا لە شووشە، تەنیا بەم سێ شتە نابێ: ددانو نینۆكو ئێسقان، ئیتر ئەم سێ شتە لکاوبن بە لەشەوە یا جیابنو بە لەشەوە نەمابن چوون یەکە. سەر بەڵگەی ئەمە فەرموودەکەی رافیعی کوڕی خەدیجە کە لە باسی پێش ئەم باسەدا رابورد کە سەرەتاکەی ئاوا دەست پێ دەکا: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە سبەینێ بە دوژمن دەگەین..تاد.

نەیی کردن لە سەربڕین بە نینۆكو ئێسكو ددان لەسەر قسەی عیززی کوڕی عەبدوسەلام تەعەببودییە، ئیبنو رەفعەیش دەفەرموێ:

حیکمەتەکەی ئەوەیە کە مردنی گیانلەبەر بە پارچەیێ لە خۆی نەبێ بەهۆی ڕەوا بوونی مردنی[1].

**مەرجەکانی سەربڕ:**

ئەوەیە موسوڵمان بێ، یا خاوەن نامە بێ، واتە: کیتابی بێ، وەك جوولەکەو گاور. سەر بەڵگەی ئەمە ئەم ئایەتەیە: {إِلاَّ مَا ذَكَّيْتُمْ} سەبارەت بە خاوەن نامەیش ئەم ئایەتەی ترە: {وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ حِلٌّ لَّكُمْ – سورة المائدة – ٥/٥} (واتە: وە خواردەمەنی ئەو ناموسوڵمانانە کە کاتی خۆی نامەی خوداییان پێ دراوە حەڵاڵە بۆ ئێوە). دیارە کە گۆشتی سەر بڕاویشیان بەر وشەی خواردەمەنی دەکەوێ. بەڵام دەبێ ئەو خواردەمەنییەیان لە دینی خۆمانا حەڵاڵ بێ، وەك نان و ئاوو گۆشتی مەڕو بزن و شتی تری وا، دەنا حەرامە وەك مەی و خوێن و مردارو گۆشتی سەگو بەراز.

سەربڕاوی غەیری خاوەن نامەکان حەرامە، چونکە حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: ڕێك وەك خاوەن نامەکان حیساب بۆ ئاگر پەرست بکەن و چ ڕەفتارو مامەڵەیێ لەگەڵ نامەدار (کیتابی)یەکان

---

[1] کوردیش بە سروشتی پاکی خۆیان هەستیان بەم حیکمەتە کردووە، بۆیە پێشینان لە زەمی خۆ خۆریدا فەرموویانە: گوتیان داربەڕوو شتێ داهاتووە دەت بڕێتەوە، گوتی: کلکەی لەخۆم نەبێ ناتوانێ. بە ڕاستی ئەمڕۆ گەلی کورد وەك داری قەراخی لێ هاتووە، تەوری کلك کوردی لێ پەیدا بووە بەناوی خیزبەوە هاکا گشتی کرد بە خەڵووز.
– وەرگێڕ –

دەکەن، هەمان رەفتاریش لەگەڵ ئەواندا بکەن، تەنیا ئەم دوو خاڵەی لێ دەرچێ: گۆشتی سەربڕاوی دەستی ئاگر پەرست مەخۆن، ژنیشیان لێ مارە مەکەن!. بتپەرست خاوەنی نامەنین، هەروا ئاگر پەرستیش، گەرچی ئاگر پەرست گومانی ئەوەیان لێ دەکرێ کە لە بنەڕەتدا نامەدار بووبن، سەر براوی دەستی پاشگەز (مورتەدد)یش ناخورێ چونکە حاڵی ئەم بەدترە لە حاڵی ئاگر پەرستو بتپەرست.

لە موسوڵمانانا دروستە منالی فامیدەو کوێرو ژن بابێنوێژیش بێ، گیانلەبەر سەر ببڕن، بەڵگەی دروستبوونی سەر بڕینی ژن ئەم فەرموودەی بوخارییە: رۆژێ کەنیزەکێکی کەعبی کوڕی مالیك لە (سەلع)ران دەلەوەڕێنێ، مەڕێ لە ڕانەکە دەئەنگێورێ، کچەکەیش فریای دەکەوێو بە بەردێکی تیژ سەری دەبڕێ، کە ئەمەیان لە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} پرسی، فەرمووی: بیخۆن.

## سەربڕینی بەچکەی ئاوسك:

سەربڕینی دایك برێتییی سەر بڕینی بەچكەی ناو سکیشی دەکەوێ، بەمەرجێ بە مردوویی لەناوسکی دەری بهێنن، یا نیمچە گیانێکی تیا مابێ، پاش تۆزێ بمرێ، ئیتر خواردنی دروستە بەبێ سەربڕینیش، بەپێی فەرموودەکەی {دروودی خوای لەسەربێ}: سەربڕینی گیانداری ئاوس برێتیی سەربڕینی بەچکەکەی ناو سکیشی دەکەوێ (ئیمامی ئەحمەد). ئەبو سەعید {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: گوتمان ئەی پێغەمبەری خودا! رێ دەکەوێ کە وشتری مێنگەو مانگاو مەڕو بزنی ئاوس سەردەبڕین بەچکەکەیان لەناوسکدایە، ئایا ئەو بەچکانە فڕێ

بدەین یا بیانخۆین؟ فەرمووی: ئەگەر ئارەزوو دەکەن بیان خۆن، چونکە سەربڕینی دایکەکەیان بڕێتیی سەربڕینی ئەوانیش دەکەوێ (د/ ئەحمەد/ ت – تاج – ٤ ل – ٢٨) جووەینی {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: وەکی تریش ئەگەر سەربڕینی دایك بڕێتیی سەربڕینی بەچکەی ناوسکی نەکەوتایە، کاتێ سکەکەی دەربکەوێ نابێ دروست بێ سەری ببڕێ، هەروەك دروست نیە ژنی ئاوس حەددی لێ بدرێ، یا بکوژرێتەوە تا سکەکەی نەبێ.

## ٣٦١) بڕیاری ئەو پارچەیەی لە زیندوو دەبێتەوە:

هەر پارچەیێ لە زیندوو دەبڕرێ وەك مردووی وایە، واتە: ئەو گیانلەبەرە ئەگەر بە مردوویی پاك بوو ئەوە پارچە جیاوە بووەکەیشی پاکە، وەك ماسیو کوللەو ئادەمیزاد، ئەگەر بە مردوویی پیس بوو پارچەکەیشی پیسە، وەك پارچەی غەیری کوللەو ماسیو ئادەمیزاد، سەر بەلگەی ئەمەیش ئەوەیە کە دەگێڕنەوە: لە حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} پرسیار دەکرێ: ئایا پارچەیێ لە دووگی وشتر یا لە دووگی مەڕ ببڕرێ حەڵاڵە یا حەرامە؟ دەفەرموێ: هەر پارچەیێ لە ئاژەڵی زیندوو ببڕرێ ئەوە ئەو پارچەیە حوکمی مردووی ئەو گیانلەبەرەی هەیە (حاکم دەفەرموێ: بەپێی مەرجی هەردوو پیرە، ئەبو داوودو تیرمیذیش گێڕاویانەتەوە، تیرمیذی دەفەرموێ: فەرموودەیەکی جوانە. بەڵام ئەم شتانە لەم یاسا گشتییە جیا دەکرێنەوە: موو و پەڕو خوریو کوڵکی هەر گیانلەبەرێ گۆشتی بخورێ پاکە، چونکە بەپێی ئایەتی قورئان

خودا ئەمانەی کردووە بە مایەی کەرەستەی ناو ماڵ هەتا کاتی مردن! دیسان لەبەر ئەوەیش ئەم شتانە بێ گیانن، لەبەر ئەوە بێ هەستن هەست بە ئیش و ئازار ناکەن لەکاتی بڕیندا، هەر لەبەر ئەمەیە کە هەندێ زانا دەفەرموێ: هەتا مووی گیانلەبەرێکیش کە گۆشتی نەخۆرێ پاکەو پیس نیە.

بەڵام بەپێی رای فەرمایشتی ساغ شاخو سمو نینۆکو ددانو ئێسقان ئەگەر بە زیندوویی لە گیانلەبەرەکە جیا ببنەوە پیسن، چونکە ئەمانە زۆر تر لە ئەندامی سەربەخۆ دەچن، چونکە ئەمانە گیانیان تیایە، هەست بەشت دەکەن، هەست بە ئێش دەکەن، هەستو هەست بە ئێشکردن نیشانەی ژیانە، کەواتە ئەگەر ببڕێن دەمرنو بەهۆی مردنەوە پیس دەبنو حوکمی مرداریان هەیە. ئەم ئایەتەیش بەڵگەی ئەوەیە کە ئێسقان ژیانی تیادایە: {مَنْ يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ – سورة يس – ٧٨/٣٦} دەڵێ: ئێسقانی رزیوی هەزاران ساڵە بەکێ زیندوو دەکرێتەوە؟ ئەی خۆشەویست! پێی بفەرموو: ئەو کەسە زیندووی دەکاتەوە کە یەکەمجار لە نەبوون دروستی کردووە).

## ٣٦٢) باسی خواردەمەنی (أحكام الاطعمة)

بڕوانە: تەجریدی بوخاری بەرگی/٥ ل – ٧٧ ز:٧٣.

خواردەمەنی بە عەرەبی پێی دەگوترێ طەعام، طەعامیش بە مەعنا مەطعوومە، وەك چۆن شەراب بە مەعنا مەشرووبە، کۆی طەعام ئەطعیمەیە، بۆیە لە ئەصڵەکەدا وشەی (اطعمە) کراوە بە عینوان بۆ ئەم باسە.

سەر بەلگەی حەڵاڵبوونی خواردەمەنییەکان ئەم ئایەتە پیرۆزەیە: {قُل لاَّ أَجِدُ فِي مَا أُوْحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَى طَاعِمٍ يَطْعَمُهُ إِلاَّ أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ - سورة الأنعام - ١٤٥/٦} واتە: جا تۆ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! بۆ بەرپەرچی گومان بڕیو شوبهەی خەڵك جاڕ بدەو بفەرموو: من لەو نامەی خودادا کە بە سرووش دێ بۆ من خۆراکێ نابینم حەرام بێ لەسەر خۆراك خۆرێ مەگەر یەکێ بێ لەم شتە قەدەغەو حەرامانە: مرداربێ، یا خوێنی ڕژاو بێ، یا گۆشتی بەراز بێ. لەگەڵ ئەم ئایەتەی تردا: {وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ - سورة الأعراف - ١٥٧/٧} واتە: نیشانەیەکی تری ئەو پێشەوا نازدارە کە خوا پێداوان پەیڕەوی دەکەن ئەوەیە کە هەر خواردنەوەو خواردەمەنییەك سروشتو تەبیعەتی مرۆڤی میانەڕەو بە پاكو باشی بزانێ حەڵاڵی دەکا بۆیان، وە هەرچی خواردنەوەو خواردەمەنییەکیش سروشتی پاکی مرۆڤی میانەڕەو بە پیسو چەپەڵی بزانێ حەرامی دەکا لە سەریان).

لە ڕاستیدا یەکێ لە مەبەستەهەرە کرنگەکانی ئایین، زانینو فێربوونی بڕیارەکان (ئەحکام)ی خواردەمەنییەکانە. چونکە گەڕان بە شوێن رزقو رۆزی حەڵاڵدا خود فەرزە، واتە: فەرزی عەینە، پێویستە لەسەر ئەرکدار (موکللەف) هەوڵی بۆ بدا، هەتا حەڵاڵخۆربێ، چونکە هەڕەشەی سەخت هەیە لەسەر خوادرنی شتی حەرام، چونکە لە فەرموودەدا دەفەرموێ: هەر گۆشتێ بە حەرام پەروەردە ببێ خۆراکی ئاگری دۆزەخە. تەنانەت ئەگەر حەرام پەرەی سەندو تێکەڵی گشت

شتێ بوو، وه نانی حهڵاڵ زۆر به گران دهست دهكهوت، ئهوه دهبێ بهپێی پێداویست لێی بخوا، نابێ زیاده خۆری بكا.

وهك مهشهووره: كهمخۆرو پاكخۆر، كهواته: وا سوننهته له خواردنی حهڵاڵیشا زیاده مهسرهف نهكرێو موسوڵمان به نانو ئاوێكی سادهی ئاسایی قنیات بكا، بهڵام لهبهر رهزیلی خێزانی خۆی نهچهوسێنێتهوه، چونكه یهكێ له رهفتاره بهرزهكانی پێشینانه باشهكانمان ئهوه بووه سك پهروهرنهبوونو سهریان نهكردۆته خواردنو خواردنهوه، بهڵام میوانه پهروهری سوننهته لهبهر ئهوه ئهگهر سفرهیشی بۆ برازێتهوه جێگهی خۆیهتی، ههروهها ئهگهر ساخ بۆ رهزای خودا ههرچهنده خزمهتی منداڵو خێزانی خۆی بكاو نانو ئاوو جلو بهرگی باشو خۆشو حهڵاڵیان بۆ فهراههم بهێنێو تێرو تهسهلیان بكا پهسهندهو خوا پێی خۆشه، به مهرجێ مهبهستی خۆشگوزهرانی ئهوان بێ تا ههست به هاوسهركهمی نهكهن، نهك بۆ شانازیو چاولێكهری!

ئهوهنده ههیه نابێ جڵهو بۆ ئارهزووهكانی نهفس شل بكرێ، وهكوو ئاژهڵ ههر چاوی له خهوو خواردنو رابواردن بێ، چونكه زاناكان لهم لایهنهوه راجیاییو بۆچوونی جیا جیایان ههیه لهسهر ئهم شێوهیه:

**یهكهم**: دهفهرموون نهفس قهدهغه دهكرێ له رابواردنی رههای رهوا، چونكه سهردهكێشێ بۆ بوغرا بوون!

**دووهم**: دهفهرموون ئارهزووهكانی نهفس جێبهجێ دهكرێ، ههتا گورجو گۆڵ ببێو ههستی گیانپهروهری تیادا بژێتهوهو بهرهبهره ههست به چاكهكانی خودا به سهریهوه بكا.

سێیەم: دەفەرمون: مامناوەندێتیو میانەکاری باشو پەسەندە، چونکە ئەگەر هەموو خۆشییەکی لێ قەدەغە بکەی تووشی کەودەنی دەبێ، ئەگەر بە تەواویش بەری بۆ بەرەڵلا بکرێ زاڵ دەبێ. سوننەتە دەستەکان زۆربن لەکاتی نان خواردندا، لە سەرەتاوە ناوی خودا یاد بکرێ، لە پاشیەوە سوپاسو ستایش بکرێ.

## ٣٦٢) خواردەمەنی حەڵاڵو خواردەمەنی حەرام:

گشت خواردەمەنییەکی پاکی باش حەڵاڵە، کە برێتییە لەوەی کە سوودی هەبێ لە خواردنو لە خواردنەوە، وە هەموو خواردەمەنییەکی پیس حەرامە، کە برێتییە لە گشت خواردنو خواردنەوەیێ کە زیانبەخش بن. مەبەست لە (پاکی باش) ئەوەیە کە تەبیعەت بیباتو نەفس حەزی لێ بکات، مەبەست لە (پیسیش) ئەوەیە کە قیزەون بێو دڵ پێی هەڵشێوێو سروشتی پاك نەیەوێ، وەکوو دەرکەوت خودا پاکیی کردووە بە مەرجی حەڵاڵ بوون، پیسیشی کردووە بە مەرجی حەرام بوون، دەی بەهۆی ژیریو هۆشی ساغەوە دەزانین کە مەبەست لە پاك ئەوە نیە کە هەموو کەسێ بە پاکی بزانێ، یا مەبەست لە پیس ئەوە نیە کە هەموو کەسێ بە پیسی بزانێ، چونکە شتی وا ستەمە، رەفتارو سروشتی خەڵك جیاجیان، ئەوەی مامە پێی خۆشە کاکە پێی ناخۆشە، لەبەر ئەوە دیارە کە مەبست خواستو ئارەزووی هەندێکیانە، جا لەبەر ئەوەی قورئان بە زمانی عەرەب دابەزیوەو لە سەرەتاوە رووی قسەی لە

عەرەب بووەو زۆرتری گوفتوگۆکان ئاراستەی عەرەب کراوە، لەبەر ئەم هۆیانە عەرەب لەم لایەنەوە بۆ بڕیاردان لەسەر پاکیو پیسی شت لە پێشترن، لە لایەکی تریشەوە سەورشتو رەفتاری عەرەبەکانیش هەموویەك نین، بەڵکوو جیاجیان، لەبەر ئەوە زۆر ئەستەمە کە رای هەموویان لەم بارەیەوە لەسەر یەك شت یەك بگرێ، لەبەر ئەمە بڕیار دەدەین کە دەگەرو بایەخ بە عەرەبی سەردەمی حەزرەت خۆیەتی (دروودی خوای لەسەربێ) ئەمەیش قازی حوسێن وا دەفەرموێ!

یاسای سەرەکی بۆ ئەمە ئەم دەستوورەیە کە دەڵێ: هەر گیانلەبەرێ عەرەب بە پاکی بزانێ حەڵاڵە مەگەر شەرع بە حەرامی دابنێ.

جا کە ئەمەت زانی بفەرموو پوختەیێ لە خۆراکی پاكو پیس باس بکەین، بزانە کە خۆراکی پاكو حەڵاڵ هەر زۆر زۆرە، وە جۆرەکانی فرەیە،ماڵیو کێویلەی هەیە، وشترو رەشە وڵاخو مەڕو بزن لە جۆری ماڵین، ئەم چوارە بە یەککرتن حەڵاڵن، لە پێش یەککرتنـدا ئەم ئایەتە بەڵگەی حەڵاڵبوونیانە: {أُحِلَّتْ لَكُم بَهِيمَةُ الأَنْعَامِ – سورة المائدة – ١/٥} (واتە: خودا حەڵاڵی کردووە بۆ ئێوە خواردنی گۆشتی ئەو گیانلەبەرانەی کە لە چەشنی ئاژەڵن) هەروا ئەم ئایەتەی تریش: {وَالأَنْعَامَ خَلَقَهَا لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَافِعُ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ – سورة النحل – ٥/١٦} واتە: وە خوای گەورە ئاژەڵی بۆ ئێوە دروست کردووە، سوودی زۆریان تیادایە بۆتان، لە خوریو موو و کوڵكو کەوڵەکانیان جلو بەرگو پێخەفو رایەخیان لێ دروست دەکەن، کە

دەبن بەهۆی بەرگری لە سەرماو گەرما، وە گەلێ سوودی تریشیان هەیە، کە یەکێ لەوانە ئەوەیە لە گۆشتەکەیان دەخۆن).

ئەسپو ماینیش گۆشتیان دەخورێ، چونکە جابیر {ڕەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: ڕۆژی غەزای خەیبەر پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} جلەوگیریی کرد لە خواردنی گۆشتی کەریماڵی، وە ڕێگەی خواردنی گۆشتی ماینو ئەسپی دا. (ش/ د/ ت/ ن).

لەچار پێی کێویش گۆشتی گا کێوی دەخورێ، گامێشیش بەر جۆری گاو ڕەشە وڵاخ دەکەوێو لە بەشی گیانلەبەرە پاكو باشو حەڵاڵەکانە، هەروا گۆشتی بزنو مەڕی کێوی دەخورێ، چ بزنو مەڕبن چ سابرێنو بەران بن، گۆشتی کەرە کێویش دەخورێ، چونکە پێغەمبەر خۆی لێی خواردووە، خوای ماڵی بووبێ، یا هەر کێوی بێ، کەری ماڵی کێویش ببێ هەر گۆشتی نادروستە، ئاسكو کەمتیارو ڕێویو کەروێشكو ڕزق (یەربووع)و ژیشكو ئیبنو عیرس[1] حەڵاڵن چونکە پاکن، گۆشتی بزنمژەیش دەخورێ، چونکە خالیدی کوڕی وەلید دەفەرموێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا بزنمژە حەرامە؟ فەرمووی نەء حەرام نیە،

---

[1] مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی بیارە - نوقمی ڕەحمەتی خودا بێ} لە دوو ڕشتەدا دەفەرموێ: ئیبنو عیرس: لە چەقەڵ کزتر، بە لەش درێژە، گوێ کورتو سەرخڕ. مامۆستا سەی عەلای سەججادی {ڕەحمەتی خوای لێبێ} دەفەرموێ: مشکی خورمایە، بەڵام لە مونجیددا وێنەی ئەمس لە مشکی خورما دەکا، کە مەردۆخ بە مشکە خۆرە تەرجەمەی کردووە. بڕوانە فەرهەنگی خاڵو هەنبانە بۆرینە.

- وەرگێڕ -

بەڵام لە وڵاتی ئێمە نیە لەبەر ئەوە دەبینم دڵم نایبات، خالید فەرمووی: جا من بزنمژەکەم راکێشت بۆ لای خۆم و لەبەر چاوی پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} دەستم کرد بە خواردنی (ش/ د/ ت/ ن — تاج/ ٤ ل — ٥).

**شتی پیس:**

حەرامیش دیسان زۆرن، وەك مارو دووپشك و قولانچە بە هەموو جۆرەکانیانەوە وەك هەرچی وردە جانەوەری زەوییە لە چەشنی گەنەو کرنوو ئەسپێ و رشك و پەپوولەو میروولەو گڵخۆرکەو کرم و تەتەڵە میران و زەردەواڵەو هەنگ و وێنەی ئەمانە. چونکە پیسن خودای گەورەیش دەفەرموێ: {وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَآئِثَ}

# ٣٦٤) بڕیاری ئەوەی کە ڵبەی هەبێ یا چنگ و چڕنووکی تیژی هەبێ:

هەرچی دانقولاپی بێ و کەڵبەی هەبێ و هێزی تێك شکاندنی نەچیری هەبێ خواردنی نادروستەو گۆشتی حەرامە وەك شێرو پڵەنگ و گورگ و ورچ و مەیموون و فیل و تیمساح (نەهەنگی وشکانی) و وشتر گا پەڵنگ (زرافە) و چەقەڵ، چونکە ئەبو ثەعلەبە {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} هەر دڕندەیێ کەڵبەی هەبێ، خواردنی گۆشتەکەیی قەدەغە کردووە (ش/ د/ ت/ ن — تاج/ ٤ ل — ١٤) لەبەر ئەوەیش (وەك ئیمامی شافیعی) {رەحمەت و رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ:

ئـەم جـۆرە درِندانـە هەمیـشە بـە کەڵبـەی خۆیـان راوی گـۆرو نەچـیر دەکەن، هیچ درِندەیێ تـر ئـەوان راو ناکـا. زانـایش هەیـە دەڵـێ: زەرافـەو چەقەڵو فیلو تیمساح حەڵاڵن.

گۆشـتی سـەگ نـاخورێ چـونکە ئـەویش لـە درِنـدە پیـسەکانە بـەرازیش بـەپێی ئایـەت هـەم پیـسەو هـەم حەرامـە، بـەڵام لـە پـشیلەدا راجیـایی هەیـە، فـەرموودەی سـاغ ئەوەیـە کـە حەرامـە، چـونکە بـەهۆی کەڵبـەی خۆیـەوە هێـزی تێکـشکاندنی هەیـە، لـە هـەمان کاتـا پـیس خۆریشە، لە صەحیحی موسلیمدا دەفەرموێ: ئـەبو زبـیر دەفـەرموێ: لـە بـارەی بـەهای سـەگو پـشیلەوە پرسـیارم لـە جـابیر کـرد، فـەرمووی: پێغەمبەر {درووددی خوای لەسەربێ} هەرِشەی لە شتی وا کـردووە، وە دەیفـەرموو {درووددی خوای لەسەربێ} لـە راسـتیدا هـەرکاتێ خودای گـەورە شـتێ حـەرام بکـا بەهاکەیشی حـەرام دەکـا. لـە گێرِانەوەیـەکا دەفـەرموێ: جـابیر {رەزای خوای لێبێ} دەفـەرموێ: پێغەمبـەر {درووددی خوای لەسەربێ} هـەم خـواردنی گۆشـتی پـشیلەی قەدەغـە کـردووە هـەم خـواردنی بەهایـشی (م/ د/ ت/ ن = موسـلیمو ئـەبو داوودو تیرمیـذیو نەسـائی، برِوانـە تـاج/ ٤ ل ١٦، هـەر ئامـاژەیـێ بـۆ تـاجو ریـاض الـصالحین، بـۆ لاپـەرِە بـە (ل) بکـرێ، بـۆ وەرگـەرِاوە کوردییەکەیانـە، ئەگـەر بـە (ص) کـرا بـۆ ئەصـڵە عەرەبییەکەیانە — وەرگێرِ).

سەمۆر[1] و سمۆرەو فەنەكو (فاقم) لەسەر قسەی فەرمایشتی ساغ حەلاڵن، دەقی شافیعی لەسەر حەلاڵ بوونیان هەیە. هەر باڵندەیێ كە چنگی تیژو نینۆكی قولاپیو دەنووكی لاری هەبێو راوی پەلەوەرو نەچیر بكا، وەك هەلۆو سیسارکەو بازو شەهینو کۆلارە، ئەمانەیش بەهەر رەگێ بن بەهەموو چەشنو جۆرەکانیانەوە حەرامنو گوشتیان ناخورێ. چونكە ئیبنو عەبباس {وەزای خوایان لێبێ} دەفەرموێ: هەر درندەیێ كە كەڵبەی هەبێ، یا هەر باڵندەیێ كە چنگو چڕنووكی هەبێ پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} خواردنی

گۆشتەكەیی قەدەغە كردووە. (م/ د) هەروا هەر شتێ پیس خۆر بێو پیسایی‌و مردارو شتی وا بخوات گۆشتەكەی نادروستە، واتە: حەرامە، وەك قەلەبازەڵەو قەلەڕەشە، كە لە قەلەبازەڵە گەورەترە، چونكە ئەم دوانەیش بە پیس حلێبن.

---

(١) مامۆستا مەلا عبدولكەریم لە دوو رشتەدا دەفەرموێ: سمور: كزتر لە چەقەڵ، سمۆرە نیە. مامۆستای مەردۆخیش دەفەرموێ: سەمۆر: سمورە، وێنەی (السمور: سەمۆر) لە فەرهەنگی مەردۆخا دەق لە وێنەی (السمور) دەچێ لە (المنجد)دا. بۆ (فەنەك)یش مەردۆخ دەفەرموێ: جانوری است ازجنس روباە أما كوچكتر، وأن غیر دلك است: واتە: جانەوەرێكە لە تیرەی ڕێوییە، بەلام بچكۆلەترە، بەلام دەڵەك نیە. بۆ عەرەبییەكەیشی هەر (فنك)ی نووسیوە. بڕوانە (المنجد) دەبینی پێناسەی (فەنەك) لە مونجیدو لە فەرهەنگی مەردۆخدا زۆر لەیەك نزیكن. بەهۆی تەرجەمەی بێ سەرو بەرەوە هەزاران هەڵە لە هەموو بابەتێ پەیدا بوون. خودا پەنامان بدا لە شتی وا.

